## کورتەیەك لە میژووی دروست بوونی

# دەوڵەتی ئیسلامی

## هەندێ لە بیروباوەرە بنچینەییەکانی

نوسەر : السنی الکردی

ئامادەکردنی کۆمەڵی ڕزگاربوو

نوسەر : السنی الکردی
ئامادەکردنی کۆمەڵی ڕزگاربوو



# کورتەیەک لە مێژووی دروست بوونی

# دەوڵەتی ئیسلامی

## هەندێ لە بیروباوەڕە بنچینەییەکانی

نوسینی : الســــني الكــــردی

ئامادکردنی : کۆمەڵی ڕزگاربوو

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إنِ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسنَا وَمِنْ سَيئَات أَعْمَالنَا مَنْ يَهْده اللهُ فَلا مُضلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْللْ فَلا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ..اما بعد:

**بەکورتی مێژوو و چۆنێتی دروست یوونی دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلامی﴿ اللَّهُ تعالی ﴾ پایەدارترو سەربەرزتری بکات .**

لەدوای روخانی دەوڵەتی بەعسی کافر لە عێراق و داگیرکردنی عێڕاق لەلایەن ئەمریکای خاچپەرست و هاوپەیمانەکانیەوە لەساڵی ١٤٢٤ کۆچی موجاهیدان و تێکۆشەرانی ڕێگەی﴿اللَّهُ تعالی﴾ جیهاد و تێکۆشانیان لەبەرامبەر ئەمریکای کافر و موڕتەدەکانی عێڕاق لە ڕافیزە و حیزبە عەلمانیە موڕتەدە کوردەکاندا ڕاگەیاند بەبێ وەچان گورزی کاریگەریان دەدا لەدوژمنانی ﴿اللَّهُ تعالی﴾ و سەرانی کوفر و ڕیدەیان دەکرد بە ئامانجی خۆیان .

ئەم جیهاد و تێکۆشانە موبارەکە لەسەر دەستی پیرۆزی پیاوانی بەڕێزی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە مهاجرین و ئەنصار بەرپاکرا ، لاوانی خوێن گەرمی ئومەتی ئیسلام لە هەموو لایەکەوە بۆ بەژداری کردن لە جیهادی کافران شەرەف مەندبوون بەشەرەفی

هیجرەت و لەسەرووی هەمویشیەوە بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ﴿اللّٰہ تعالی﴾ ڕویان دەکردە عێراق و موسڵمانانی ئەهلی سوننەتی عێراقیش بەتایبەتی ئەهلی سوننەتی عەرەبی عێراق باوەشی گەرم و بەسۆزیان بۆ برا مهاجیرەکان دەکردەوە و شان بەشانی یەکتری لەپێناوی سەرخستنی دینی پاك و پیرۆزی ئیسلام دا ماڵ و گیانی خۆیان دەبەخشی ، یەك لەو مهاجیرە بەڕێزانە کە هیجرەتیان کردبوو بۆعێراق شەیخی بەڕێز و سەرکردەی بەتوانا شەیخ ابو مصعب الزرقاوی بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێـت، ئەم شێرە پیاوە بەڕێزە پێش روخانی رژێمی کافری بەعس لە عێراق هیجرەتی کرد بۆ عێراق و لەگەل ژمارەیەك موجاهیدی مهاجر و ئەنصاردا کۆمەڵێکی ئیسلامیان لەسەر بنچینەی تەوحید و جیهاد لە عێراق دا دروست کرد ، پێغەمبەری پێشەوامان ﴿ﷺ﴾ ئەفەرمێ : (( ما کان لله ینمو وما کان لغیره ینقطع )) واتە : ئەوەی بۆ اللّٰہ بێت گەشە دەکات وەئەوەشی بۆ غەیری اللّٰہ دەبڕێت و کۆتایی دێت .

لەگەڵ ڕوخانی عێراق داو دروست بوونی بواری جیهاد کردن شێخ ابو مصعب و هاوەڵە بەڕێزەکانی کە ژمارەیان زۆرنەبوو و بانگەشەی جیهادیان کرد و بەناوی ﴿اللّٰہ تعالی﴾ەوە دەستیان پێکرد ، ﴿اللّٰہ تعالی﴾ پیت و بەرەکەتی خستە کارەکەیانەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەسەرکەوتنی بەرچاو گەشەکردندا بوون لە هەموو لایەکەوە موەحیدانی موجاهید و راستگۆ ئەهاتن بۆ لایان و کۆدەبونەوە و پەیمان و بەیعەتیان پێ دەدان .

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ جیهاد و تێکۆشانی موجاهیدانی ڕاستگۆ لە عێڕاق بەرەو پێش دەچوو تا شێخی زەرقاوی لە ساڵی ١٤٢٤ی کۆچی کۆمەڵی پیرۆزی " توحيد والجهاد " یان ڕاگەیاند و بە راگەیاندنی ئەم ڕەوتە جیهادیە هێرشەکان بۆ سەر دوژمنانی ئیسلام زیادیان کرد و زۆر بەرەو پێش چوون ، شێخی سەرکردە " ابو مصعب الزرقاوي " رحمه الله ، گرنگی زۆری بەبواری تەوحید دەداو باوەڕی وابوو کەدەبێت بە تەوحید و جیهاد تێکۆشان بکرێ و وەك بینرا کە ناوی" توحيد والجهاد " بۆ کۆمەڵەکەی هەڵبژارد ، وە هەروەها باوەڕی وابوو کە دەبێت جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ﴿اللهَ تعالى﴾و بەئامانجی دروست کردنی دەوڵەتی ئیسلامی بێت ، هەوەکو ئەوەی لەپێش شەهیدبوونی دا بە ماوەیەکی کورت مژدەی دروست بوونی دەوڵەتی ئیسلامی دا لە داهاتویەکی نزیکدا .

لەدوای دروست بوونی کۆمەڵی " توحيد والجهاد " بە کۆبونەوەی ژمارەیەك پێکهاتوو لە کۆمەڵێ لایەنی موەحید و موجاهیدی تر بە هەموان (( مەجلیسی شورای موجاهیدین)) یان لەگەل کۆمەڵی " توحيد والجهاد " دا دروست کرد وەکو دانانی بەردی بناغەی دروست بوونی دەولەتی ئیسلام .

لەساڵی ١٤٢٦ کۆچی و لەدوای زیاتر لە سێ ساڵ بانگەواز و جیهاد و تێکۆشان سەرکردەی خۆشەویست ( ابو مصعب الزرقاوی ) بە

بۆردومانی ئەمریکای خاچپەرست لە ویلایەتی دیالی شەهید بوو داواکارین لە ﴿ اللَّهَ تعالى ﴾ بەشەهیدی وەرگرتبێ .

لەدوای شەهیدبوونی شێخی سەرکردە ، شێخ ابو مصعب هاوەڵانی بەڕێزی درێژەیان بەکاروانی پڕخێر و بەرەکەتی جیهاد و تێکۆشان دا لە عێڕاق، وە بەتێپەربوونی چەند مانگێك لە شەهیدبوونی شێخ ابو مصعب ، دەولەتی عێڕاقی ئیسلامی لە عێڕاق ڕاگەیەنرا و زۆربەی زۆری موجاهیدانی موەحیدی سەر ڕاست پەیمان و بەیعەتیان دا بە دەولەتی عێڕاقی ئیسلامی بە ئیمارەتی شێخی بەڕێز شەیخ ( ابو عمر البغدادی رحمه الله ) .

دەوڵەتی عێراقی ئیسلامی جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلامی لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا ڕاگەیاند و دادگای شەرعی لە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی دا دامەزراند و دەزگای فەرمان کردن بەچاکە و نەهی کردن لە خراپەی دروست کرد لەگەل جیهاد و تێکۆشانی بەردەوام بەرامبەر بە کافران و موڕتەدان.

لەڕاستێتی ڕێباز و پەیرەوی دەولەتی ئیسلامی لە عێڕاق و ڕاستگۆیی سەرکردە بەڕێزەکانی ، شەهیدبوونی سەرکردە و ئەمیرە بەڕێزەکانێتی ، کەگیانی پاکی خۆیان کردە فیدای ڕێگای پیرۆزی﴿اللَّهَ تعالى ﴾.

لەساڵی ١٤٣١کۆچی دا شێخ ابو عمر البغدادی ئەمیری ئیمانداران لەدەولەتی عێڕاقی ئیسلامی لەگەل وەزیری جەنگ شێخ (ابوحەمزەی مهاجر رحمه الله ) لە عێڕاق لە رووبەرو بونەوەیەکی

گەورەو بەهێزدا بەپلەی بەرزی شەهادەت گەیشتن ، لەدوای شەهیدبوونی ئەمیر و وەزیرە بەرێزەکەی شورای دەولەتی عێڕاقی ئیسلامی شەیخی بەڕێز شەیخ ( ابو بكر البغدادى ) یان هەڵبژارد بە ئەمیری دەولەتی عێراق ئیسلامی .

لەساڵی ١٤٣٢ لەگەل ڕاپەرینی ڕوبەرووبونەوی خەڵکی چەوساوە و ژێردەستەی شام دا بەفەرمانی شێخ (ابوبكرالبغدادى )بۆسەرخستنی موسڵمانانی چەوساوەی شام کۆمەڵێك لە موجاهیدانی دەوڵەتی عێڕاقی ئیسلامی ڕەوانەی شام کرد فەرمانی دەست پێکردنی جیهاد و تێکۆشانی پێ دان ، لەبەر هۆکاری( ئەمنی) ناوی "جبــهة النصرة " لەبەشی دەولەتی عێڕاقی ئیسلامی شام نرا ، پاش تێپەربوونی زیاتر لەساڵێك بە فەرمانی ئەمیری ئیمانداران شێخ ابو بكر البغدادى ، هەر دوو ناوی ( دەولەتی عێڕاقی ئیسلامی ) و ( جبهة النصرة ) ی گۆری بە (( دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام )) .

لەپاش سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکان کە ﴿اللَّهَ تعالى﴾بەخشی بە ئیمانداران و دەولەتە پیرۆزەکەیان ، دەوڵەتی ئیسلامی عێراق و شام بەپشتیوانی ﴿اللَّهَ تعالى﴾ توانی چەندەها شار و شارۆچکە و ئاوایی فەتح بکات و لە پیسی کوفری کافران و مورتەدان پاکیان بکاتەوە ، ئەوە زۆر بە گرنگ زانرا لە لایەن شورای دەوڵەتی ئیسلامی عێراق و شامەوە کە فەرمانی پەروەردگار جی بەجێ بکرێ بە دروستکردنی دەولەتی خیلافەتی ئیسلامی و دانانی خەلیفەی بەڕێزی ئیمانداران بۆیە لە١ی رەمەزانی ساڵی ١٤٣٥دا لەسەر زمانی شێخی موجاهیدی بەڕێز شێخ ( ابو محمدى عدنانى ) وتەبێژی فەرمی دەولەتی

ئیسلامی عێراق و شام دەولەتی خیلافەتی ئیسلامی راگەیاند و ڕایگەیاند کە ئەهلی حل و عقد لە دەولەتی ئیسلامی عێراق و شام و ئەمیرەکانی جیهاد و کەسایەتیە ناودارەکان بەیعەتی خیلافەتیان داوە بە شێخی بەڕێز و خۆشەویست شێخ ابو بکر بغدادی و شێخ ابو بکر یش ﴿اللَّهُ تعالی﴾بیپارێزێ بەیعەتەکەی وەرگرت و بەوەش سوپاس بۆ﴿اللَّهُ تعالی﴾لەدوای سالانێکی زۆر لەنەبوونی خەلیفە بۆ موسلمانان ، موسڵمانان خەلیفە و دەولەتی خیلافەتیان بۆ گەڕایەوە . ڕاگەیاندنی دەولەتی خیلافەت و بەیعەت دان بە خەلیفە ، موسڵمانانی ڕاستگۆی دلخۆشکرد و کافران مورتەدانی لە دوای ڕاگەیاندنی خیلافەتی ئیسلامی هێنایە لەرزە .

کافران مورتەدان لە یەهود و نەصاری و ڕافیضە و سەرۆکە مورتەدە بەناو سونیەکان بانگەشەی جەنگیان بۆ لەناودانی دەولەتی خیلافەت لێدا بەلام﴿ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴾ .

سوپاس بۆ ﴿اللَّهُ تعالی﴾نەیانتوانی نەك دەولەتی خیلافەت لەناو بدەن بەڵکو نەیانتوانی بێ هێزیشی بکەن و بەر لە پێشرەویەکانی بگرن لە فەتح و ئازادکردنی شار و ئاوایی یە داگیرکراوەکاندا کە لەلایەن کافران و مورتەدانەوە داگیرکرابوون .

داواکارین لە ﴿ اللَّهُ تعالی ﴾دەولەتی خیلافەتی ئیسلامی سەربخات و خەلیفە بەڕێزەکەی بپارێزێ .

## هەندێ لە بیروباوەرو ریبازی دەولەتی ئیسلامی :

**یەکەم:** روخاندن و لادانی هەموو دیاردەیەکی شیرکی بە ئەرك و واجب دەزانین و ئەو ڕێگایانەش بەرەو شیرك دەچن بە نارەواو حەرام دەزانین .

**دووەم:** ڕافیضە کۆمەڵی شیرك و ریدەن و لە دین هەلگەڕاوەن ، ولەگەل ئەوەشدا کە موشریکن دروشمە دیارەکانی ئیسلام جێ بەجێ ناکەن و بەرپاناکەن .

**سێ یەم:** ساحیر بەکافر ومورتەد دەزانین . کوشتنیشی بە ئەرك و اجب دەزانین و تەوبە و پەشیمان بونەوەی لێ قبول ناکرێ لە ئەحکامی دنیادا ئەگەر تەوبەکەی دوای ئەوەبوو کەتە بەردەستی دەسەڵاتی موسلمانان.

**چوارەم:** تەکفیری هیچ کەسێك ناکەین لە موسلمانان بە تاوان کە نویژ بکات بۆ لای قیبلەمان ، مەگەر ئەو تاوانە بەحەلال بزانێ ، وە وتەمان لە (ئیمان)و پێناسەی ئیمان دا ، ناوەراست و (وسط)ە.

**پێنجەم:**گەرانەوە و تحاکم کردن بۆ شەرع بە ئەرك و واجب دەزانین لەڕێگای بەرزکردنەوە و گەرانەوەی حوکم بۆلای دادگا شەرعیەکان لە دەولەتی ئیسلامی.

**شەشەم:**ڕیزگرتن لە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﴿ﷺ﴾ بە ئەرك و واجب دەزانین ، و پێشخستنی وتەو کاری هەرکەس لە پێش ووتەو کاری پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ بة نارةواو حەڕام دەزانین.

**حەوتەم:** باوەرمان وایە کە عەلمانیەت بە جیاوازی ئاڵاو ڕێچکەکانیەوە و لە نیشتمان پەرستەکان و نەتەوەپەرستەکانەوە ، کوفری ئاشکران و هۆکاری دەرکردنە دەرەوەی هەرکەسن لە میللەتی ئیسلام .

**هەشتەم:** هەرکەس یارمەتی و هاوکاری داگیرکەر و یارمەتی دەرەکانیان بدات بەهەرشێوەیەك لە شێوازەکانی یارمەتی و هاوکاری بە کافر و موڕتەدی دەزانین .

**نۆیەم:** جیهاد و تێکۆشان لە ڕێگەی﴿اللَّهَ تعالی﴾لەکاتی داگیرکەرانی (ئەندەلوس)ەوە بە فەرزی عەین دەزانین ، واتە لەوکاتەوە لەسەر هەموو موسڵمانێ ئەرك و واجبە کە جیهاد و تێکۆشان بەرامبەر بە کافران بکات.

**دەیەم:** باوەرمان وایە کە خانە و جێگە و ولاتەکان (دیار)ئەگەر شەریعەتەکانی کوفری تیا باڵادەست بوو وە دەسەلاتی زۆر تیایدا بۆ ئەحکامە کوفریەکان بوو وە ئەحکامی ئیسلام تیایدا باڵادەست نەبوو ئەوە ئەو جێگە و خانە و ولاتە ولاتی کوفرە(دارالکفر)ە.

**یازدەهەم:** وە کوشتاری شورطە و سوپای دەولەتی طاغوت و ریدە وە هەرناوێکی تریان لە خۆیان گرتبێ بە ئەرك و واجب دەزانین .

**دوازده :** وەجەماعە و کۆمەلە جیهادیەکانی تر کە لە گۆڕەپان و مەیداندا هەن بە برای دینی خۆمانیان دەزانین ، بەکافر و فاجیریان نازانین و وایان پێ نالێین.

**سیازده :** هەر جەماعەو کۆمەڵێ یان هەرکەسێ پەیمان نامە لەگەل داگیرکەردا دابمەزرێنێ ، ئەوە ئێمە بەهیچ شێویەك پەیوەست نابین پێوەی ، بەڵکو رەتی دەکەینەوە و بەنارەواو باطلی دائەنەین.

**چوارده :** وە رێزگرتن لە زانا و و عالمە بەکار و راستگۆکان و بەرگری کردن لێ یان بەئەرك و واجب دەزانین ، وە لەکاتی نازلە و کێشەکان دا سەرچاوە لەوان وەردەگرین و پرسیان پێ دەکەین .

**پازده :** وە ماف و حەقی هەرکەسێ کە لەپێش ئێمەدا لە جیهاد و تێکۆشان دا بوبێ دەزانین و لەجێگەی شیاوی خۆیا ندا دایان دەنێین ، وەئەگەر خۆشیان نەبن ، بەخێر و چاکە لە گەل ماڵ و منداڵی دا هەلسوکەوت دەکەین.

**شانزه :** ڕزگارکردنی زیندانی و ئەسیری موسلمان بەتایبەت خوشکە موسلمانە ئەسیرو زیندانی یەکان لەدەستی کافران ، لەسەرخۆمان بەئەرك و واجب دەزانین ، بەجەنگ و جیهاد یان بە گۆڕینەوە بە ئەسیری کافر و بەماڵ وە هەروەها سەرپرشتی ماڵ و منداڵی ئەسیر وشەهیدەکان بە واجب دەزانین.

**حەڤدە :** وە فێربوون و شارەزایی دینی ئیسلام لەسەر ئوممەتی ئیسلام بە ئەرك و واجب دەزانین ، وە عیلم و زانینی دنیاییش کە ئوممەت پێویستی پێی بێت ، بە ئەرك و واجب دەزانین . وە لەغەیری ئەم دوو جۆرە عیلمە (دینی و دنیایی) موباح و حەڵالە.

**هەژدە :** وە هەرشتێ بانگەشە بۆ فاحیشە و بێ رەوشتی بکات ، و یارمەتی دەری بێت و بەحەرامی دەزانین وە بە ئەرك و واجبی دەزانین لەسەر ژن کە دەم و چاوی دابپۆشێ و دوربکەوێتەوە لە سفوری و روتی و تێکەڵی کردن لەگەل پیاوی نامەحرەم داو دەبێت پەیوەست بێت بە پاکی و داوێن پاکیەوە .

وەخەڵکانێك درۆی زۆریان بۆ هەڵبەستوین و درۆیان بەدەمە کردوین کە هیچ بنچینەیەکی نیە لە عەقیدە و بیروباوەرەکەماندا .

درۆمان بەدەمەوە دەکەن کە ئێمە عەوامی موسڵمانان تەکفیر دەکەین و بەکافریان دەزانین و خوێن و ماڵیان بە حەڵال دەزانین.

وە درۆ بەدەممانەوە دەکەن و دەڵێن کە ئێمە خەڵکی بەزۆری شمشێر ناچار دەکەین کە بێنە ناو دەوڵەتەکەمانەوە، وە لەسەر ئەمە ، ئەمە هەندێك لەو بنچینە و سەوابتانەمانە کە ئەو درۆیانە ڕەت دەکاتەوە ، وە تاکو پاساو عوذر بۆ درۆزن و بواری شوبهەش بۆ ئێوەی خۆشەویست نەمێنێتەوە[١] .

[١] شێخی موجاهید ابو عمر البغدادی

لەکۆتاییدا لە ﴿ اللَّهَ تعالی ﴾دەپاڕێینەوە کە موسڵمانانی موەحید سەربخات بەسەر کافران و موڕتەداندا هەروەها دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلامی پایەدار و سەربەرزتر بکات

الاسير : السني الكردي